# چۆن هاوسەرەکەت بەختەوەر دەکەیت ؟



نوسینی أم نور

٢٠٢٢

# بسم الله الرحمان الرحيم

الحمدلله، والصلاة والسلام على رسول الله و على آله و صحبه أجمعين،
أما بعد ....

هاوسەرگیری ئارامی نەفسە بۆ هەردوولا ،
وە حەوانەوەی جەستەیە و وە دڵنیای روحە،
وە درێژ کردنەوەی ژیانە بۆ ئەوسەری.
یەکێکە لە نیعمەتەکانی دوونیا ، کە ئارامی ژیان و قیامەتی
لەسەرتە ڕەحم و خۆشەویستی و ڕێزە .
خوای گەورە سبحان وتعالی دەفەرموێت

:يَا أَيُّهَا النَّاسُ اتَّقُوا رَبَّكُمُ الَّذِي خَلَقَكُمْ مِنْ نَفْسٍ وَاحِدَةٍ
وَخَلَقَ مِنْهَا زَوْجَهَا وَبَثَّ مِنْهُمَا رِجَالًا كَثِيرًا وَنِسَاءً
(النساء) ١

لەم نامیلکەدا باس لە چۆنیەتی مامەڵەکردنی ئافرەت لەگەڵ هاوسەرەکەی دا دەکەین چۆن دەتوانیت هاوسەرەکەت بەختەوەر بکەیت ؟

گرنگی خێزانمان بۆ دەردەکەوێت چونکە ئافرەتانمان بنچینەی خێزان بەختەوەری ماڵەکە لەسەر تێگەیشتن و ئەقڵیەتی خاتونی ماڵەکە دەڕوات ، وە خێزانیش یەکێکە لەهەرە شتە جوان و گەورەکانی کۆمەڵگەکەمان بنچینەی کۆمەڵگەیەکی باش و خێزانێکی باشە .

ئامانجمان گۆڕین و خزمەتێکی بچوکە بە کۆمەڵگا .

## ◈ حفظ غيبة الزوج(پاراستنی دیار نەبوونی مێرد)

پێویستە لە سەر ئافرەت کە پارێزگاری لە نهێنیەکانی مێردو ئەوەی لە نێوانیاندا ڕودەدات بکات،وە منداڵەکانی بپارێزێت بە باش پەروەردەکردن وفێرکردنیان زانستی شەرعی و دوونیای وچاودێری کردنیان تەندروستیان،وە هەروەها پارێزگاری کردن لەکەس وکارو خزمەکانی بەوەی کە خراپەیان لە گەڵدا نەکات وڕێز لە کەس وکارو میواانەکانی بگرێت.

## ◈ حسن الاستقبال (بە جوانی پێشوازی کردن)

ئەو کردەوانەی ئافرەت مێردەکەی پێ بەختەوەر دەکات بە جوانی پێشوازی لێ کردنیەتی کاتێك کە دەگەڕێتەوە ماڵەوە، پیاوان لە دەرەوە توشی ماندوو و هیلاکبونێکی زۆر دەبن هەم بەجەستەو وە بە مێشکیش بە جوانی پیشوازی لێکردن و خۆ ڕازاندنەوەت و زەدەخەنەکەت هیلاکی ئیش لە سەر پیاوەکەت لادەبات،وە قورسی و نارەحەتیەکانی ژیانی لە سەر سووك دەکات ، ئەوکات هەست بەوە دەکات کە ماڵەکەی بەتەواوەتی جێگای حەوانەوە ئیسراحەتە ، ئەوەی ئافرەتان دەیکەن کە بە بۆڵەو بە ئیهمالەوە پێشوازی لە مێردەکانیان دەکەن یەکێکە لە هەڵەکانی ئافرەتان . کە ساردی دەخاتە نێوان هەردووکیان ، بۆیە تکایە وریای ئەم خاڵە بن زۆر گرینگە بۆ ژیانی هاوبەشیتان !

## ◈أوقات الزينة (کاتەکانی خۆڕازاندنەوە)

ئافرەتی ژیر ئەو ئافرەتەیە کەدەزانێت شتەکان لە شوێنی خوی دابنێت، وەکات و وەقتی شتەکان دەزانێت وە خۆی لەو کاتانەدا دەڕازێنێتەوە کە خوای گەورە ئاماژەی پێ کردووە لەکاتەکانی پشوودا و پێش نوێژی بەیانی و لە کاتی نوێژی نیوەڕۆ و لەپاش نوێژی خەوتنان (العشاء)وەلەکاتی گەڕانەوەی مێردەکەی لە سەفەر.وە لەوکاتانەی کە هاوسەرەکەی ئارام و دڵخۆشەو و نەک کاتێک کە هەست بە ماندووی زۆر بکات ، وە دەبێت ئەمە بەردەوام بێت نەک تەنها چەند مانگی سەرەتا بێت و دواتر ساردبێتەوە ، چونکە کاتێک ئافرەت دەبێتە هی پیاوێك بەتەوای بون و نەبوونی دەبێتە هی ئەو هەر لەبەر ئەوەیە پێویستە ئافرەتی ژیر بزانێت کە چۆن هەموو سەرنج و بینی مێردەکەی بۆ لای خۆی ڕادەکێشێت .نەک تەنها شەهوەتی و حەزەکانی بۆلای خوی ڕابکێشتت بەڵکو پێوێستە دڵـ و ئەقڵیشی بۆ لای خوی ڕابکێشێت

#زنجیرەی_٣

## ◈ يجب على المرأة تعلم عقيده (واجبه لەسەر ئافرەتان بە خۆ فێرکردنیان بە عەقیدە)

شتێکی کە لەسەر ئافرەتان واجبە ئەویش خۆ فێرکردنیان بە زانستی شەرعی کە زۆر واجبە کە بەختەوەری مێردەکەی بەدەست دەهێنت بۆ بوون بە ئافرەتێکی نمونەی پێویستە و یەکێکە لە بنچینە سەرەکیەکان کە پێویستە لەسەر ئافرەتان فێربوونی زانسی شەرعیە وەتایبەت عەقیدە و سونەت و قورئان بزانێت ، وە بەختەوەری مێرد تەنها لە ڕووخسارو شتە دوونیایەکان بەدەست نایەت بەڵکو گرنگترین شت ئەوەیە کە ئەوەی هاوسەرەکەت نەیزانێ تۆ فێری بکەیت .هیچ شتێک نەهێڵیتەوە بۆی بەشێوەیەک ئەوندە هەنگاوی باش بەرەو پێشەوە بەریت ، بەشێوەیەک کە بنچینەیەکی بتەوت بونیاد نابێت لە ئەقیدەیەکی ڕاست و درووست کە بەتەواوی تێگەیشتن بۆ دین بەشێوەیەکی درووست و ڕاست بێت نەک بە شێووی تەقالید بێت ، تۆ بونیاتنەری خێزانەکەتی

#زنجیرەی_٤

## ◈تجميل العقل و الفهم روحها ، (جوانکردنی ئەقڵ و تێگەیشتن و دەرون )

یەکێک لەو شتانە کە بەختەوەری مێرد بەدەست دێت جوانی تێگەیشت و عەقڵیەتی لە هاوسەرەکەی ، تەنها جوانی دەرەوە شکل و خۆڕازاندوە گرنگ نیە بەڵکو پێویستە لەگەڵیدا ئەقڵیشی و دەرونیشی و تێگەیشتەکانی جوانتربکات ،وە پێویستە کە ئافرەت دایمەن کەسێکی میهرەبان و لەسەر خۆبێت بەرامبەر هاوسەرەکەی وە دوژمنایەتی نەکات ، وە نابێت خۆی فەرز بکات بەسەریدا بەڵکو دەبێت ، گوێڕایەڵی بۆ مێردەکەی بکات وە دڵنیای و ئارامی و متمانە بداتە مێردەکەی ، وە گفتوگۆکردن لەکات دیاری کراوەکان و پلان دانان و بۆ گفتوکۆیەکی هێمنان چونکە ئامانە مصدر بۆ بەرادەوامی و بۆ هەست کردن و مانەوەی خۆیشەویتی لە نێوان خێزانەکاندا ، چونکە ئەمانە وا دەکەن کە ئەقڵێکی کراوە تێگەیشتنێکی زۆرە ژیان کردن ئاسانترو و ئارامتر و خۆشتردەبێت

#زنجیرەی_٥

## ◈ طاعة الزوج(گوێڕایەڵی مێرد)

مێرد سەرکردەیە ، بەڵام سەرکردایەتی خۆشەویستی و ڕێزگرتن و بەخشین و خۆبەختکردن نەک بە کۆیلەکردن وزاڵبوون  سنوربەزاندن بۆ مافی ژنەکەی ، ژنیش پاڵپشت و یارمەتیدەری ئەمە گوێڕایەڵی کردن پیاو یەکێکە لە سیفاتەکانی ئافرەتی ئاقڵ و ئافرەتانی ئیماندار ، ئەمە نەک بۆ زیات کردنی خۆشەویستی نێوانیان بەڵکو  و لە ئیسلامیشدا ئاماژەی پێ کراوە وەک پێغمبەری خوا صلی الله علیه وسلم دەفەرمۆێت:

ئەگەر فەرمانم بە کەسێک بکردایە سوژدە ببات بۆ کەسێکی تر ، ئەوا فەرمانم بە ئافرەت دەکرد سوژدە بۆ مێردەکەی ببات.

لێرەدا گرنگی ئەوە دەردەکەوێت کە پێویستە ئافرەت گوێڕایەڵی بۆ پیاوەکەی هەبێت ، لە جێبەجێکردنی داواکاریە دوونیا و شەرعیەکاندا ، ئەما نەچێتە شتی حەرامەوە

## ◈ حسن تدبير المنزل (بەچاکی بەڕێوبردنی ماڵ)

یەکێک لە ئەرکەکانی ئافرەتی چاک و ژیر بەڕێوبردنی ماڵە ، ئەمەش بەپێ جوری ژیری ئافرەتەکە دەگۆڕێت ، وە لەسەر ئافرەت کارێکی گرنگ و پیرۆزە کە هەمیشە ماڵەکەی بە پاک و خاوێنێ ڕابگرێت چونکە بەڕاستی ماڵ ماڵی ژنە ، لە ڕێکخستن و دیزاین کردنی شتەکاندا کاتێک ئافرەتەکە لێهاتوو شارەزابوو ، دەتوانێک بە شتانێکی کەمیش بێت ماڵیکی تەرتیب و ڕێک و جوان درووست بکات . وا پێویست دەکات ئافرەتی ژیر لێزانینی هەبێت بۆ درووست کردنی خواردن و شیرینیەکان ، ئەو شتان کە وەک ئافرەتێک پێویستە شارەزابێت ،، وە پێویستە بزانیت لە کەمترین زەرەر زۆرترین قازانج بەدەست بهێنت ، یاسای نوێ دابنێت ، بۆ خوارد گەر جارێک خواردنێک لە شتێکی کەم بوو پێویست دەکات بەشتێکی تر قەرەبووی بکاتەوە ، یان بۆ نمونە ؛ خاتونێک بریانی درووست دەکات ، بۆبەیانی بریانیەکە ماوەتەوە بەڵام کەمە ، دەتوانێت برنجی ترلێبێنت و تێکەڵی بریانەی بکات کە ئێوارە درووستی کردووە تا ئەوەی تازەو زۆرتریش ببێتەوە ،

وە هەمیشە ماڵەکەی بە بۆنی خۆش بڵاوبکاتەوە . تا ماڵێکی هێمن و ئارام بێت . چونکە پیاوان لە دەرەوە ماندوو شەکەت دەبن وە کاتێک هاوسەرەکانتان گەڕانەوە ماڵەوە بە زەردەخەنەکانتان و بۆنە خۆشەکانی خواردنەکانتان اسراحەتێک بکەن ، هەرکاتێک دەرەوە پڕبوو لە بێ ڕەوشتی دڵ ڕەقی ژاوە ژاوی ڕاکردن بە دوای پارەدا ، ماڵێک بنیاد بنێ کە هاوسەرەکەت و ماڵەکەت پڕبێت لە خۆشەویستی و ڕەوشت بەرزی و ڕێز و نەرم و نیانی

#زنجیرەی_٧

## ◈التعاون على الطاعة (هاوكاری کردنی یەکتری لەسەر خوا پەرستی وطاعەت)

یەکێک لە گرنگترین شت کە دەتوانی هاوسەرەکەتی پێ بەختەوەر بکەیت لە دوونیاو قیامەتدا ئەوەیە کە ببینێت خێزانەکەی ئەرکەکانی بەرامبەر بە خوا بە جێ دێنێت، وە هەمیشە هاوکاری یەکتر بکەن لەسەر بەردەوام بوون بە قورئان لەبەر کردنەکەتان و وە خۆ پێگەیاندنتان لە طلبی علمی ، بەڵام ئەوندە خۆت باش پێبگەینە کە هیچت نەمێنتەوە بۆئەوکاتە ، بەڵام بێگومان دەزانین کە زۆرێک لە خەڵکی دوای ئەوەی کە زەواجی کردووە وە منداڵیشی بووە بەردەوام بووە توانویەتی ببێتە حافظ قورآن خزمەتێکی کتێبەکەی الله ی کردووە چ کردووەیەک لەوە باشتر !؟
، وە هاریکاری مێردەکەشی دەکات لەسەر بە جێ هێنانی سونەتەکانی خۆشەویستمان پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) ، وە هەمیشە لە خزمەت کتێبی سەلەف و ئەهلی سوونە کە بختەوەری دونیا و قیامەت و هاوسەر و منداڵ و دەوروبەرەکەت بەدەست دەهێنیت

## ◈ الاعتراف بالخیر فی الزوج (دانان بە چاکەکانی هاوسەر)

یەکێک لەو شتانەی کە هاوسەرەکەتی پێ بەختەوەر دەکەیت ، ئەوەیە کە هەمیشە ئافرەت دان بە کارە چاکەکانی مێردەکەیدا بنێت ،چونکە ئەمە دەبێتە هۆی زیادبووی خۆشەویست و دڵسۆزی لە نێوان هاوسەرەکانتدا ، وادەکات کە هەمیشە هاوسەرەکەت بەردەوام بێت لەکارە چاک و باشەکانی ، لەگەڵ تۆدا وە لەگەڵ دەوروبەردا . ئافرەتی ژیر دەزانێت لەچ کاتێدا ئەو کێشانەی کە هەیە بە شێوەیەک بەهاوسەرەکەی بڵێت ، کە هاوسەرەکەی بەوپەڕی جوان تێگەیشتنەوە لەیەکتر تێبگەن و چارەسەری بکەن . وە چارەسەر کردنی کێشەکانتان بەبێ ئەوەی بچێتە دەرەوەیماڵەکەت هونەرێکە بۆ ئەم سەردەمە زۆر پێویستە وە دەبێت لێزانیت هەبێت بۆ بەکارهێنانی ئەم هونەرە ، چون دڵنیابە گەر کێشە بچوکیش بێت چوە دەرەوەی ماڵەکەت گەورە دەبێت ، وە لەکاتی کێشەکاندا هەموو خراپەی پیاوەکەت مەدەوە بەڕووی دا بەڵکو باشەکانیشی ببینە ، دانان بە چاکەی هاوسەرەکەتدا لە بوونی وەفا و بەئەمەک بوونتە بۆ هاوسەرەکەت

#زنجیرەی_٩

## ◈الرضا بما قسم الله ( ڕازی بوون بەبەشی خوا)

یەکێک لەو شتانەی تر کە هاوسەرکەتی پێ بەختەوەر دەکەیت ،وریا و ئاگاداربە ئەویش ڕازی بوونە بە بەشی الله ، لەوەی کە هەتانە ، سووپاسی الله بکەن ، ئەوەی نیشتانە ئارامی بگرن لەسەری، هەمووکات پێویست ناکات کە بیدەیتەوە بە سەروچاوی هاوسەرکەت لەوانەیە ئەوەی خەڵک نیەتی ئێوە هەتانە بەزۆریشەوە بەڵام ئافرەتان هەمیشە شتی خەڵکی بە گەورەتر وباشتر دەبێت کە دەبێت ئاگادارین و وە

پێغەمەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی :

سەیری لەخۆتان خوارتر تر بکەن و سەیری لەخۆتان سەرور مەکە ،

هەروەها پغەمبەری خواصلى الله عليه وسلم فەرموویەتی :هەرکەسێک بەیانی هەستاو جەستەی ساغ بوو بە ئارامی و ئاسایش بوو لەناو کۆمەڵەکەیدا ، وە خواردنی ئەو ڕۆژەی هەبوو ئەوە وەک ئەوە وایە هەموو دوونیای دەستکەوتبێت ،

بەڕاستی ئێمە نەک هی بەیانی بەڵکو هەی زیاتر لە شەش ساڵیشمان هەبێت هەر دەترسن بڕوامان بەمە نیە چونکە ئەوەندە لە ڕزق و خواردن و خواردنەوە دەتسرین ، وەک ئەوەی کە خودا نەبێت و بڕوامانبە هەمووشتەکانی تر هەبت بڕوامان بە ڕزقی الله نەبێت ، خودا ڕزقی مێرو و چۆلەکەیک دەدات لەم وەرزە سەرمایەدا ، ئیتر چۆن ڕزقی ئێمە نادات ، بۆیە ئەی خوشکی سەنگینم تەنها داوای پارەی حەڵاڵ لە هاوسەرکەت بکە و ڕازی ببە بەشی خودا

## ◈احسن التصرف مع أقارب زوجك (نواندنی هەڵسووکەوتی جوان لەگەڵ خزمی پیاوەکەت)

یەکێکی تر لەوشتانەی کە هاوسەرەکەتی پێ بەختەوەر و دڵخۆش دەکەی جوان مامەڵەکردنتە لەگەڵ نزیکەکانی ، و ڕێز گرتنە لەگەڵ دایک و باوکی و خوشک و براکانی و سەردانیکردنیایە ، بەڵام بەپێ پێویست و بە پێی شەرع ، وە ئاگاداربە خۆت بپارێزە لە تێکەڵاویت لەگەڵ برای هاوسەرکەت (هێوەر) .

کە بەڕاستی لەم سەردەمەدا زۆر کەمن ئەوەی گوێ دەدات بەم پەیوەندیە چونکە تێکەڵاویەکی زۆر هەیە لەنێوانیان ، کە وەک ئەوەی مەحرەمی بێت قسەو تێکەڵەوی زۆر دەکرێت ، وە هەروەها ئاگاداری قسەکردنەکانت بە قسەی ماڵی خۆت مەهێنەوە بۆ ماڵی خەزورت و قسەی ماڵی خەزوورت مەبە بۆ ماڵی باوکت ، گەر باشیش و شتی ئاسایش بێت هەرگیز باسی مەکەو خۆتی بەدوور بگرە لێ .چونکە سیفەتێکی ناشرینە کە هەمیشە لەماڵی خەزورت بڵی ماڵی براکەم ئەوشتەیان هەیەو ئەوەیان نیە ، هەرواها کەم قسە بکە لەماڵیان و خۆت تەداخولی هەموو شتێک مەکە ، بۆ ماڵەکەی خۆت وەک ڕووناکرەوەیەک بە بەڵام لەماڵی خەڵکیدا ، تاریکی مەبە بەسە ، کە لەشتێکیش نازانیت قسەی تێدامەکە وخۆت بەدوور بگرە لە مناقەشەکردن لەگەڵیان ، بە تایبەت لەگەڵ دایک و باوکی هاوسەرەکەت،هەمیشە ئافرەتێکی بێدەنگی سەنگین و ژیر بە کە دڵی دایک و باوکی وخرمەکانی ڕابگریت کە ئەمەش وادەکات هاوسەرەکەت پێ سەربەرز و بەختەوەربێت

## ◈ قول الحقيقه (وتنی ڕاستیەکان)

یەکێکی تر لەو شتانەی هاوسەرەکەتی پێ دڵخۆش وسەرفراز دەکەیت هەمیشە ڕاست گۆییتە لە گەڵیدا ،ڕاستگۆی بە وشەو بە قسەو ڕەفتارەکاندا ، هەرشتێک هەبوو گەر ناخۆشیش بێت وتنی ڕاستەکان زۆر باشترە بێ ئەوەی پێچ و پەنای تێدا بخەن ،نەک تەنها افرەت بەڵکو زۆر زەورترە کە پیاوانیش بە هەمان شێوە کە ڕاستگۆبن لە بچوکترین قسەوە کە کردبێتان . بەڵام هەندێک شت هەیە بە تایبەت بە ئافرەتانەوە کە پێویست ناکات بیکات لای هاوسەرەکەی وەک باسکردنی شکڵ و شێوەی ئافرەتانی تر . یان هەندێک شت هەیە لە ژیاندا نەوتنی باشترە ، بەڵام با هیچ دووریەک نەبێت لە نێوانتان

## ◈الاخبار السارة (هەواڵە دڵ خۆشکەرەکان)

باشتر وایە کە ئافرەتی مسوڵمان هەمیشە هەواڵە دڵخۆشکرەکان بە پیاوەکەی بدات ، کاتێک کە هاوسەرەکەی دەگەڕێتەوە بۆ ماڵ و پێشوازی لێ بکات بەو بەڕی جوان و زەردەخەنەوە ، چونکە بێگومان دەزانین پیاوان لە دەرەوە توشی ماندوو بونێکی زۆر دەبن لەدەرەوە ، وە لەکاتی هەبوونی کێشەکاندا هەوڵبدە کە کاتی گونجاودا پێ بڵێت ، نەک هەموو کات شتە ناخۆشەکانی پێ بڵێت ،

## ◈ الجماع (خەوتن)

یەکێک لە مافەکانی مێرد بەسەر خێزانەکەیەوە ، بەپەلە وڵامەی بداتەوە، هەرکاتێک بانگی کرد بۆ سەرجێگاکەی ،

أَبِي هُرَيْرَةَ ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ : " إِذَا بَاتَتِ الْمَرْأَةُ هَاجِرَةً فِرَاشَ زَوْجِهَا، بَاتَتْ تَلْعَنُهَا الْمَلَائِكَةُ " . قَالَ ابْنُ جَعْفَرٍ : " حَتَّى تَرْجِعَ " .

حكم الحديث: إسناداه صحيحان

پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) دەفەرمۆێت : ئەگەر ئافرەتێک جێگەی هاوسەرەکەی بەجێ هێشت ، هەتا بەیانی فریشتەکان نەعلەتی لێ دەکەن

ابن جعفر گوتی : هەتا دەگەڕێتەوە .
حەدیسەکەش صحیحە

بەڵام ئەوەی گرنگە ئەم حوکمە بۆ هەمووکات نیە ، چونکە کاتێک ئافرەت هەر عوزرێکی شەرعی هەبێت ئەوا ئەو کاتانە ناگرێتەوە

هاوسەرگیری ئارامی نەفسە بۆ هەردوولا ،

وە حەوانەوەی جەستەیە و وە دڵنیای روحە،

وە درێژ کردنەوەی ژیانە بۆ ئەوسەری

